جُزْءٌ

مِنْ أَخْبَارِ أَبِي حَفْصٍ

# عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ وَسِيرَتِهِ

تأليف

أَبِي بَكْرٍ مُحَمَّدِ بْنِ الْحُسَيْنِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الآجُرِّي

المُتَوَفَّى سَنَة (٣٦٠ هـ)

وەرگێڕانی: أبو عبدالله

پێداچونەوەی: هلال عبدالله عمر

# ژیاننامەی ئەم ئیمامە بەڕێزە بەکورتی :

ناوی عمر بن عبد العزيز بن مروان بن الحكم بن أبي العاصي بن أمية بن عبد الشمس بن عبد مناف .

دایکی أم عاصم کچی عاصم بن عمر بن الخطاب ە .

کونیەکەی : أبو حفص .

لە مەدینە لە ساڵی ٦١ لەدایک بووە، لەوساڵی کە دایکی ئیمانداران میمونة رضي الله عنها خێزانی رسول الله ﷺ تێیدا وەفاتی کرد .

- سفيان بن عاصم وتی : عمر بن عبد العزيز ڕوخسارێکی ڕوونی جوانی هەبوو، جسمی لاواز بوو - واتە قەڵەو نەبوو نەک لاوازی جەستەیی بێ - ، ڕیشێکی جوانی هەبوو، چاوەکانی قوڵ بوون، نێوانی هەردوو برۆی بریندار بوو، وە پرچی ڕەش و سپی تێکەڵ بوو .

- ئیمامی أحمد بن حنبل رحمه الله وتی : ئەگەر کەسێکت بینی عمر بن عبد العزيز ی خۆشویست، وە بەباشە باسی کرد و دەریخست، ئەوا بزانە کە لە پشت ئەمەوە خێر هەیە إن شاء الله .

- ميمون بن مهران وتی : الله تعالى بەڵێنی لە خەڵک وەرگرتووەش بە ناردنی پێغەمبەر لەدوای پێغەمبەر، وە الله تعالى بەڵێنی لە خەڵک وەرگرتووە بە عمر بن عبد العزیز .

- مالک بن دینار وتی : خەڵک دەڵێن : مالك بن دینار زاهیدە، مالك بن دینار زاهیدە، بەڕاستی زاهید عمر بن عبد العزیز ە ئەوەی کە دونیا پێدرا بەڵام وازی لێهێنا .

باسکردنی هەواڵەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله و ژیاننامەکەی لەناو مسوڵمانان هەتا وەفاتکردنی .

١ - لە ئەسلەم ەوە رضي الله عنه فەرمووی : شەوێکیان لەگەڵ عومەری کوڕی خطاب بووم بە ناو شاری مەدینەدا دەگەڕا، کاتێك ماندوو بوو پشتی دا بە دیوارێکدا لە نیوەی شەودا، لەوکاتەدا ئافرەتێك بە کچەکەی دەووت : کچەکەم، بڕۆ بۆلای شیرەکە و ئاوی لەگەڵ تێکەڵ بکە .

کچەکەش بە دایکی ووت : دایە گیان، ئایا ئاگاداری ئەو فەرمانەی پێشەوای ئیمانداران نەبووی ئەمڕۆ؟

دایکەکە ووتی : ئاگادارکردنەوەکەی چی بوو کچەکەم؟

کچەکە ووتی : بەڕاستی فەرمانی بە بانگکارێ کرد بانگەواز بکا : کەوا ئاو تێکەڵ بە شیر نەکرێت.

دایکەکە بە کچەکەی ووت : کچەکەم، بڕۆ بۆ لای شیرەکە تێکەڵی بکە لەگەڵ ئاودا، تۆ لە شوێنێکی نە عومەر دەتبینێ نە بانگدەری عومەر .

کچەکەش بە دایکی ووت: دایە گیان، واللە من کەسێ نیم گوێڕایەڵی ئەو بکەم لە ئاوەدانیدا، وە سەرپێچی بکەم لە چۆڵەوانیدا.

وە ئیمام عومەر هەموو قسەکانی دایك و کچەکەی بیست، بە ئەسلەمی ووت : ئەی ئەسلەم دەرگاکە بناسەوە، وە شوێنەکەش پێ بزانەوە، دوای ئەوە لە گەڕانەکەی بەردەوام بوو، کاتێ بەیانی کردەوە ووتی : ئەی ئەسلەم بڕۆرەوە بۆ شوێنەکە و بزانە ئەو ئافرەتە کێ بوو قسەکەی دەکرد وە کێ وەڵامی دەدایەوە، ئایا پیاویان هەیە؟

ئەسلەم دەڵێ چووم بۆ شوێنەکە بینیم کەوا کچێك بوو لەگەڵ دایکی دەژیا مێردیشی نەبوو، وە ئەو دەنگەش دایکی بوو، کە پیاویان نەبوو، هاتمەوە بۆ لای عمری کوڕی خطاب هەواڵم پێدا، جا بانگی کوڕەکانی کرد و کۆیکردنەوە، فەرمووی : ئایا کەستان پێویستی بە ژن هەیە بۆی بهێنم؟

وە ئەگەر باوکتان جوڵەیەکی هەبایە بۆ ئافرەتان ئەوا کەستان پێشی نەدەکەوتن بۆ ئەو کچە تا بیخوازن .

عبداللە ووتی : هاوسەرم هەیە .

وە عبدالرحمن یش ووتی: هاوسەرم هەیە.

عاصم ووتی : باوکە من هاوسەرم نییە، بۆ منی بخوازە .

ناردی بۆلای كچەكە و لە عاصمی مارەكرد، عاصم لەو ئافرەتە كچێكی بوو، وە كچەكەی عاصمیش كچێكی بوو، كچەكەش عمری كوڕی عبدالعزیزی بوو رحمه الله .

٢ – مالك ی كوڕی دینار وتی : كاتێك عمری كوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفەی مسوڵمانان، شوانی مەڕەكان لە سەر چیاكان دەیانوت : ئەو خەلیفە چاكە كێیە كە هاتۆتە سەردەسەڵات؟

پێیان ووترا : ئێوە چۆن بەوەتان زانی؟

ووتیان : لەبەر ئەوەی كاتێ پیاوێكی صالح دەبێتە خەلیفە شێر و گورگەكان وازدەهێنن لە هێرشكردنە سەر مەڕ و ماڵاتمان .

٣ - لە مجاهد ـەوە فەرمووی : مەهدیەكان حەوتن، پێنجیان ڕۆیشتن، دووان ماون .

خارجە ووتی : ابوبكر، و عمر، و عثمان، و علی، وە عمری كوڕی عبدالعزیز رحمه الله .

٤ - لە ریاح ی كوڕی عوبەیدە ـوە ووتی : عمری كوڕی عبدالعزیز م بینی لەو كاتەدا فەرمانڕەوای شاری مەدینە بوو، كەسێكی پیر خۆی دابوو بەسەر دەستی .

ریاح دەڵێ لە نەفسی خۆم ووتم : ئەوە کەسێکی دڵڕەقە بۆیە خۆی دەدا بەسەر دەستی فەرمانڕەوادا، ئینجا کە نوێژی کرد و هاتە ژوورەوە شوێنی کەوتم، و وتم : اللە ئیصڵاحی فەرمانڕەوا بکات، ئەو پیرە پیاوە کێ بوو خۆی دابوو بەسەر دەستتدا؟

وتی : کەواتە بینیت ئەی ریاح؟

وتی : بەڵێ .

وتی : ئەوە الخضر ی برام بوو، هات بۆ لام هەواڵی پێدام کەوا خەلافەتم پێ دەدرێ، وە دادپەروەر دەبم تیایدا .

٥ - لە ریاح ی کوڕی عوبەیدە وە وتی : پیاوێکم بینی لەگەڵ عمری کوڕی عبدالعزیزی دەڕۆیشت و خۆی دابوو بەسەر دەستیدا،

منیش لە نەفسی خۆمدا وتم : ئەوە کەسێکی دڵڕەقە، ئینجا کە نوێژی کرد وتم :

ئەی باوکی حفص ئەو پیاوە کێ بوو کە کەمێك پێش ئێستا لەگەڵت بوو خۆی دابوو بەسەر دەستتدا؟

وتی : کەواتە بینیت ئەی ریاح؟

وتی : بەڵێ .

وتی : بەڕاستی وای دەبینم کە پیاوێکی چاکی، ئەوە الخضری برام بوو، مژدەی پێدام کەوا خەلافەتم پێ دەدرێ، وە دادپەروەر دەبم .

٦ - لە ریاح ی کوڕی عوبەیدە وە وتی : هاتم بۆ لای عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله لەوکاتەد فەرمانڕەوای شاری مدینە بوو پێش ئەوەی بکرێت بە خەلیفە، ئینجا لە ماڵەکەی خۆی نەمدۆزیەوە، بۆیە بەرەو ڕووم دەهات، وە پیاوێکیش خۆی دابوو بەسەر دەستی .

لە نەفسی خۆمدا وتم : ئەو پیرە چەند دڵڕەقە، یان ئەو پیاوە، خۆی دەدا بەسەر فەرمانڕەوادا، پاشان پیاوەکەم ونکرد،

وتم : الله ئیصڵاحی فەرمانڕەوا بکات، ئەو پیاوە کێ بوو خۆی دابوو بەسەرتدا؟

وتی : کەواتە بینیت ئەی ریاح؟!

وتی : بەڵێ .

وتی: من وای دەبینم کە پیاوێکی چاکی، ئەی ریاح ئەوە الخضری برام بوو، هات بۆ لام مژدەی پێدام، وە وتی : تۆ خەلافەتت پێ دەدرێ، وە دادپەروەر دەبیت تیایدا .

: [ابن القيم له **(المنار المنيف في الصحيح و الضعيف : ص ٦٣)** دەڵێت : وە لەوانە : کە ئەو فەرموودانەی تێدایە کە باسی الخضر و ژیانی تێیدا کراوە هەموویان درۆن و تاکە فەرموودەیەکیش دەربارەی ژیانی ئەو صحیح نییە .

وە پرسیاریش لە امام البخاري کراوە سەبارەت الخضر و إلياس کە ئایا ئەوان لە ژیاندان؟

فەرمووی : ئەمە چۆن دەکرێت لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (هەموو سەری سەد ساڵێك کەس نامێنێتەوە لەوانەی کە ئەمڕۆ لەسەر زەوین) . **متفق عليه** .

**٧ - لە عمرو کوڕی قەیس ی ملائی** وتی : کاتێ عمری کوڕی عبدالعزیز بوو بە والی دەنگێکیان بیست :

ئەمڕۆ چارەسەربوو و بڕیارەکە جێگیر بوو

لەسەر عمری مەهدی عمودەکە ڕاوەستا .

**٨ - ئیمامی أبو بكر الآجري** دەفەرموێ :

وە پێم گەیشتووە کەوا کاتێ عمری کوڕی عبدالعزیز نێژرا الفرزدق شعرێکی نوسی و وتی :

چەندە شەریعەتی حەقت دانایەوە بۆیان

له كاتێ كه مردبوون و ئەوانیش چاوەڕێی تۆ بوون - واته چاوەڕێ بوون عمر بن عبد العزیز بۆیان زیندوو بكاتەوە - .

حەسرەتی خۆم و حەسرەتی حەسرەتكێشان

بۆ ئەو دادپەروەریەی كه چاڵەكان بردیان بەشێوەیەك نازانرێ چۆن

.

٩ - ریاح ی كوڕی عوبەیدە دەڵێت : عمری كوڕی عبدالعزیز پێی خۆش بوو چارەسەر وەربگرێ به هەنگوین، ڕۆژێك داوای هەنگوینی له خانەوادەكەی كرد بەڵام له لایان نەبوو، كەمێك دوای ئەوە هەنگوینیان بۆ هێنا، لێی خوارد و زۆر پێی خۆش بوو، به خێزانەكەی وت : ئەو هەنگوینەتان له كوێ هێنا؟

هاوسەرەكەی ووتی : خزمەتكارەكەم به دوو دینارەوە نارد به سواری هێستری بەریدەكەوە - پۆستەچی - و هەنگوینەكەی بۆ كڕیم .

عمر وتی : سوێندت بۆ دەخۆم دەبێ هەنگوینەكەم بۆ بێنی، ئەویش جامه هەنگوینەكەی بۆ هێنا، ئیمامی عمری كوڕی عبدالعزیزیش به مزایەدە فرۆشتی، نرخی هەنگوینەكەی بۆ گەڕاندەوە، باقی تریشی خسته ناو خەزێنەی مسوڵمانانەوە - بیت المال - ، ئینجا وتی : ئاژەڵی مسوڵمانانت ماندوو و شەكەت كرد بۆ حەز و ئارەزووی عمر؟ .

١٠ - سهل ی كوڕی صدقة خزمەتكاری عمری كوڕی عبدالعزیز وتی : هەندێك لە كەسە نزیكەكانی عمری كوڕی عبدالعزیز بۆیان گێڕامەوە كەوا كاتێ عمری كوڕی عبدالعزیز خەلافەتی گرتە دەست گریانێكی زۆر بەرزیان لە ماڵەكەی بیست، پاشان پرسیاركرا دەربارەی گریانەكە، وترا :

بەڕاستی عمر كەنیزەكەكانی سەرپشك كردووە .

وتی : بەڕاستی ئەركێكم كەوتۆتە سەرشان كە مەشغوڵی كردووم لە ئێوە، ئەوەی پێی خۆشە ئازادی بكەم ئەوا ئازادی دەكەم، وە ئەوەی دەیەوێ بمێنێتەوە با بمێنێتەوە، هیچ شتێكی بۆ نییە لە لایەن منەوە - واتا لە سامان و دارایی، والله اعلم - ، كەنیزەكەكانی گریان لە نائومێدبوونەك لەو رحمه الله .

١١ - لە عبدالعزیز ی كوڕی عمر ی كوڕی عبدالعزیز ەوە وتی : كاتێ عمری كوڕی عبدالعزیز سلێمانی كوڕی عبدالملك - خەلیفەی پێش خۆی - خستە ناو گۆڕەوە، كاتێ دەرچوو لە گۆڕەكەی هەستی بە لەرینەوەی زەوی كرد، وتی ئەوە چییە؟

وترا : ئەوە كاروانی خیلافەتە ئەی پێشەوای باوەڕداران، نزیك كراوەتەوە بۆتۆ هەتا سواری بی .

جا عمر وتی : من چیم داوه لەوە، دووری بخەنەوە لێم، هێسترەکەم بۆ نزیك بکەنەوە، هێسترەکەی بۆ نزیك کرایەوە، سەرۆکی شوڕتەکان لە پێشی دەڕۆیشت بە شمشێرێکەوە .

عمری کوڕی عبدالعزیز وتی : دووربکەوە لە من، چیم داوە لە تۆ، بێگومان من تەنها پیاوێکم لە مسوڵمانان، پاشان ڕۆیشت و خەڵکیش لەگەڵی ڕۆیشتن هەتا چوونە ناو مزگەوتەوە، چووە سەر مینبەرەوە و خەڵکی لێی کۆبوونەوە .

عمری کوڕی عبدالعزیز وتی :

ئەی خەڵکینە، بەڕاستی من تاقی کراومەتەوە بەو ئەمرە - خیلافەت - بەبێ ئەوەی پێشنیاری منی تێدابووبێ یاخود داوام کردبێ، نە ڕاوێژی مسوڵمانانی تێدابووبێ، دەسا من ئەو بەیعەتەی لەگەردنی ئێوەیە بۆ من لەخۆمم کردەوە، بۆ خۆتان یەکێک هەڵبژێرن .

خەڵکی بەیەك دەنگ هاواریانکرد :

بێگومان تۆمان هەڵبژاردووە ئەی پێشەوای ئیمانداران، وە بەتۆ ڕازیبووین، دەست پێ بکە لەسەر خێر و بەرەکەت .

کاتێ بینی کە دەنگەکان هێور بوونەوە، خەڵکی هەموو بەو ڕازیبوون، سوپاس وستایشی خوای گەورەی کرد، سەڵەواتی دا لەسەر

پێغەمبەر ﷺ پاشان وتی : ئامۆژگاریتان دەکەم بەترسان لە الله، چونکە بەڕاستی ترسان لە الله بەدیلی هەموو شتێکە، وە لە ترسان لە الله تعالى هیچ بەدیلێ نییە، بۆیە کاربکەنن بۆ دوارۆژتان - قیامەت - چونکە بێگومان ئەوەی کاربکات بۆ ئاخیرەتی، الله تعالى کاری دونیای بۆ ئاسان و دەستەبەر دەکات .

وە نهێنیەکانتان چاك بکەن الله تعالى ئاشکراکانتان چاك دەکات.

وە زۆر یادی مردن بکەن، وە زۆر بەباشی خۆتانی بۆ ئامادەبکەن پێش ئەوەی مردن پێتان بگات، چونکە بەڕاستی لەناوبەری خۆشیەکانە، کەسێك لەنێوان خۆی و ئادەم هیچ باوکێکی زیندووی نەبێت ئەوا ئەویش ئەسڵی هەیە لە مردندا - واتە لە ئادەم تاکو خۆت هیچ یەکێك لە باب و باپیرانت نەماون، کەواتە تۆش هەر ئەمریت - .

وە بێگومان ئەو ئوممەتە جیاوازی نەبووە لە پەروەردگارەکی عزَّوَجَل، وە نە لە پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە نە لە کتابەکەی - قورئان - ، بەڵکو جیاوازیان تێکەوتووە لەسەر دینار و درهەم، وە من سوێند بە الله تعالى نایبەخشم بە هیچ کەسێ بە ناحەق و باطل، وە حەقی کەسیش زەوت ناکەم.

دوای ئەوە دەنگی بەرز كردەوە تا خەڵكی ببیستن، جا وتی : ئەی خەڵكینە، هەركەسێ گوێڕایەڵی الله تعالی بكات ئەوا گوێڕایەڵی كردنی واجبە، بەڵام ئەوەی سەرپێچی الله تعالی بكات ئەوا گوێڕایەڵی بۆ نییە، گوێڕایەڵم بن لەوەی گوێڕایەڵی الله تعالی دەكەم، جا ئەگەر سەرپێچی الله تعالی م كرد ئەوا گوێڕایەڵی منتان لەسەر نییە .

پاشان دابەزی و چووە ژوورەوە، فەرمانی كرد پەردەكان لابران، وە ئەو فەرشانەی كەوا بۆ خەلیفەكان ڕادەخران هەڵگیران .

وە فەرمانی كرد كەوا بیانفرۆشن و پارەكەی بخەنە ناو خەزێنەی مسوڵمانان - بیت المال - .

دوای ئەوە ڕۆیشت بۆ شوێنی حەوانەوەی هەتا كەمێك بخەوێ، كوڕەكەی عبد الملك كوڕی عمر هات بۆلای و پێی وت : ئەی پێشەوای باوەڕداران، دەتەوێ چی بكەیت؟

عمر وتی: ئەی كوڕە شیرینەكەم كەمێك دەخەوم .

عبدالملك وتی : دەخەویت و وەڵامی سكاڵاكان نادەیتەوە؟!

عمر وتی : كوڕەكەم، شەو نەخەوتم لەبەر وەفاتی مامەت سلێمان، كە نوێژی نیوەڕۆم كرد پاشان وەڵامی سكاڵاكان دەدەمەوە .

عبدالملك وتی : ئەی پێشەوای باوەڕداران، گەرەنتی چییە کە تاوەکو نێوەڕۆ بژیت؟!

عمر وتی : نزیك بەرەوە لێم کوڕەکەم، لێی نزیك بووەوە گرتی و ناوچەوانی ماچ کرد و وتی : سوپاس و ستایش بۆ الله تعالی کە لە پشتی من کەسێك دەرچوو یارمەتیم دەدا لە بەڕێوبردنی دینەکەم،

ئیمامی عمر دەرچوو و خەوەکەی نەکرد، جا فەرمانی بە بانگەواز کارەکەی کرد بانگ بکات : ئەوەی سکاڵایەکی هەیە با بەرزی بکاتەوە بۆ ئەمیری باوەڕداران .

پیاوێکی ذیمی - ئەوەی کە بەڵێنی لێ وەرگیراوە سەلامەت بێت لە ئەهلی کیتاب - کە خەڵکی حمص بوو هەستا بۆلای، سەر و پرچی سپی بوو وتی : ئەی پێشەوای ئیمانداران، داوات لێدەکەم بە کتابی الله تعالی حوکم بدەیت .

عمر وتی : مەسەلە چییە؟

کابرا وتی : عەباسی کوڕی وەلیدی عبدالملك زەویەکەی زەوت کردووم، عەباس لەوێ دانیشتبوو .

ئیمامی عمر بە عەباسی وت : ئەی عباس چ دەڵێی؟

عباس وتی : پێشەوای ئیمانداران وەلیدی کوڕی عبدالملك بۆی بڕیبوومەوە، کتابێکیشی بۆ کردووم .

ئیمامی عمر وتی : چی دەڵێی ئەی ذیمی؟

ذیمیەکە وتی : ئەی پێشەوای ئیمانداران، داوات لێدەکەم بە کتابی الله تعالی بڕیار بدەی .

عمر وتی : کتابی الله تعالی لە پێشترە شوێنی بکەوین وەك لە کتابی وەلیدی کوڕی عبدالملك .

زەویە زەوتکراوەکەی بۆ بگەڕێنەوە ئەی عباس، عباسیش زەویەکەی بۆ گەڕاندەوە .

ئەو ڕۆژە وازی لە هیچ سکاڵایەك نەدەهێنا کە لەبەر دەست خۆی و خانەوادەکەی بوو ئیللا وەڵامی دەدایەوە سکاڵا لە دوای سکاڵا وە حەقەکەی دەگەڕاندەوە بۆ خاوەنەکەی، جا ئەو هەواڵە گەیشتەوە بە عمری کوڕی وەلیدی کوڕی عبدالملك، ئەویش بۆ عمری کوڕی عبدالعزیزی نووسی :

بەڕاستی تۆ خراپەت کردووە بەرامبەر بە خەلیفەکانی پێش خۆت و عەیبدارت کردوون، وە لە ڕێی ئەوان لاتداوە لەبەر ڕق لێبوونەوەت لێیان، وە ڕق ئەستووربوونت بەرامبەر بە منداڵەکانیان لە دوای ئەوان، پچڕاندووتە

ئەوەی کە الله تعالی فەرمانی کردووە بگەیەنرێ، کاتێ چووی بۆ ماڵ و میراتی قورەیش - لێت سەندوونەتەوە - ، خستووتەتە ناو خەزێنەی مسوڵمانان بە زوڵم و دوژمنایەتی .

جا لە الله تعالی بترسە کوڕی عبدالعزیز، وە بیکە بە چاودێری خۆت کاتێ زوڵمت کرد، ئەمین نەبووی لەسەر مینبەرەکەت هەتا کەسە نزیکەکانی خۆت تایبەتمەند کرد - بە دەسەڵات - بە زوڵم و زۆرداری .

جا سوێند بەوکەسەی محمد ﷺ تایبەتمەندکردووە بەوەی تایبەتە بەو، بێگومان زیاتر دوورکەوتوویتەوە لە الله تعالی بەهۆی دەسەڵاتەکەت کە وا گومانت برد ئەو دەسەڵاتە بەڵایە لەسەرت، کەمێك لە مەیلەکەت کورت بکەوە، وە بزانە کەوا تۆ لە ژێر چاودێری جباری (سبحانه وتعالی) وە لەژێر دەسەڵاتی ئەوی و وازت لێناهێنێ لەسەر ئەوە .

ئەی پەروەردگار لە سلیمانی کوڕی عبدالملك بپرسە لەوەی کردوویەتی بەرامبەر ئوممەتی محمد ﷺ .

کاتێك عمری کوڕی عبدالعزیز نامەکەی خوێندەوە، بۆی نووسییەوە :

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

له بەندەی خودا عمر پێشەوای ئیمانداران، بۆ عمری كوڕی وەلید، سڵاو له سەر نێردراوانی خودا، وە سوپاس و ستایش بۆ الله تعالی پەروەردگاری جیهانیان.

أمّا بعد :

به دڵنیاییەوە نامەكەتم پێ گەیشت، وە به هاوشێوەی نامەكەت وەڵامت دەدەمەوە .

یەكەم مەسەلەی تۆ كوڕی وەلید كەوا باس دەكرێ كەوا دایكت (بنانه) یه كەنیزەكی (السكون)، له بازاری حمص دەگەڕا و دەچووه ناو دوكانەكانەوە، دوای ئەوە خوای گەورە زاناترە بەو، دیناری كوڕی دینار له (فيء)ی مسوڵمانان دایكتی كڕی و دایه باوكت بەدیاری، به تۆ دووگیان بوو، خراپترین له سك هەڵگیرا و خراپترین لەدایك بوو .

دوای ئەوە گەورە بوویت و بوویته كەسێكی زۆردار و كەله ڕەق، وا گومان دەبەی كه من له زاڵمان بم كاتێ تۆ و خانەوادەكەتم بێ بەش كردووە له (فيء الله)، - فيء : ئەو دەسكەوتەی كه مسوڵمانان به دەستی دەهێنن له كافران به بێ جەنگ - ، ئەوەی كەوا مافی كەسه نزیكەكان و هەژاران و بێوەژنەكانی تێدایه، وە بێگومان زاڵمتر له من و وازهێنەرتر له پەیمانی الله تعالی ئەو كەسەیه تۆیەكی منداڵی گەمژەی كردووە به دەسەڵاتدار بەسەر

سوپای مسوڵمانانەوە، حوکم دەکەیت لەنێوانیان بە ڕەئی خۆت، وە لەوەشدا هیچ نییەتێکت نەبووە تەنها خۆشەویستی منداڵ بۆ باوکی، جا وەیل بۆ تۆ، وە وەیل بۆ باوکیشت، دژایەتیکارتان چەند زۆرە لە ڕۆژی قیامەت، وە باوکت چۆن ڕزگاری دەبێ لە دژایەتیکارەکانی؟

وە بەڕاستی زاڵمتر لە من و وازهێنەرتر لە پەیمانی الله تعالی ئەو کەسەیە حەجاجی کوڕی یوسفی - والی بوو بەسەر عێراق و ڕۆژهەڵات - ، کردە دەسەڵاتدار بەسەر پێنج یەکی عەرەب، خوێنی حەڕامی دەڕشت و ماڵی بە حەڕام دەبرد .

وە بەڕاستی زاڵمتر لە من و وازهێنەرتر لە پەیمانی الله تعالی ئەوەیە کە قورەی کوڕی شریکی عەرەبی دەشتەکی کردە دەسەڵاتدار لە مصر، وە ڕێگەی پێدا بە مۆسیقا و گۆرانی و خواردنەوەی عەرەق .

وە بەڕاستی زاڵمتر لە من و وازهێنەرتر لە پەیمانی الله تعالی ئەوەیە کە وایکرد عالیەی بەربەری پێنج یەکی عەرەبی بەرکەوێ .

جا ماوەیەك مۆڵەتت دەدەمێ ئەی کوڕی بنانە، هەتاوەکو دوو بازنەکە دەگەونەوە بە سك - هەتا لە کارە گرنگەکان تەواو دەبم - ، وە دەستکەوتەکان دەگەیەنمەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئەوکاتە کاتم تەرخان دەکەم بۆ تۆ و خانەوادەکەت، دەتانهێنم بۆ دادگاییەکی سپی و بێ خەوش،

مادەم ئێوە وازتان هێنا لە حەق و سەرچاوەکانی ڕێگاتان گرتبوو - واتە ماڵ و سامانی خەڵکتان بە ناحەق وەردەگرت و لە خراپە سەرفتان دەکرد، والله اعلم - ، وە لە دوای ئەوەش زیاتر کە هیوام وایە فرۆشتنی گەردنی خۆتی تێدا ببینیەوە - تاوەکو مافی خەڵکی بدەیتەوە - ، وە دابەشکردنی نرخەکەت لە نێوان هەتیو و هەژار و بێوەژنەکان، چونکە بێگومان تۆ حەق و مافی هەمووانت لەسەرە .

وە سەلام لە سەرمان، وە زاڵم و ستەمکاران سەلامی الله تعالی بەدەست ناهێنن .

جا کاتێك باس و خواسی عمری کوڕی عبدالعزیز گەیشتەوە بە خەواریجەکان، چۆن وەلامی سکالاکانی داوەتەوە و مافی خەڵکی گەڕاندووەتەوە، کۆبوونەوە و وتیان : پێویست نییە لەسەرمان کەوا لەگەڵ ئەو پیاوە - عمری کوڕی عبدالعزیز - بجەنگین .

١٢ - لە سیاری کوڕی حەکەم ـەوە وتی : یەکەم شتێك کەوا بینرا لە عمری عبدالعزیز - دوای بوون بە خەلیفە - ئەوە بوو کاتێ سلیمانی کوڕی عبدالملك شاردرایەوە ئاژەڵەکەی سلیمان ئەوەی کە بەردەوام سواری دەبوو هێنرا بۆ عمری کوڕی عبدالعزیز بەڵام ئەو سواری نەبوو، بەڵکو سواری ئەو ئاژەڵەی خۆی بوو کە پێی هاتبوو، پاشان چووە ناو کۆشکەکەوە و ئەو فەرشەی کە سلیمان لەسەری دادەنیشت بۆی ڕاخرا، بەڵام لەسەری

دانەنیشت، دوای ئەوە چووە مزگەوت و سەرکەوتە سەر مینبەر، سوپاس و ستایشی الله تعالی کرد، دوای ئەوە وتی :

أمّا بعد : بەڕاستی دوای پێغەمبەرەکەتان ﷺ هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نییە، وە دوای ئەو کتابەی دابەزی بۆ سەر ئەو - قورئان - کتابێکی ترتان نییە، بزانن ئەوەی الله تعالی حەلاڵی کردووە بۆتان ئەوە حەلاڵە هەتا ڕۆژی قیامەت، وە ئەوەی الله تعالی حەڕامی کردووە ئەوا حەڕامە هەتا ڕۆژی قیامەت، بزانن من قازی نیم - واتە بە ئارەزووی خۆم بڕیار بدەم, والله اعلم - ، بەڵکو جێبەجێکارم، وە بەڕاستی من داهێنەر نیم - لەدیندا - , بەڵکو شوێنکەوتەم - قورئان و سوننەت بە تێگەیشتنی پێشینی خۆم - ، ئاگادار بن بۆ هیچ کەسێ نییە گوێڕایەڵی بکرێ لە سەرپێچی کردنی الله تعالی بزانن بێگومان من باشترینی ئێوە نیم، بەڵکو من کەسێکم لە ئێوە جگە لەوەی الله تعالی باری منی قورستر کردووە لە چاو ئێوە .

دوای ئەوە باسی پێداویستییەکانی خۆی کرد .

**١٣ - ابن سليم الهذلي** وتی : عمری کوڕی عبدالعزیز ووتاری دا و وتی:

أمّا بعد، بێگومان الله تعالی ئێوەی بە گەمە و بێ هۆ دروست نەکردووە، هیچ شتێکی لە ئەمر و فەرمانی ئێوەی وازلێنەهێناوە و پشتگوێی نەخستووە، وە بێگومان ڕۆژێکی بەڵێندراوتان بۆ هەیە - قیامەت - کە الله تعالی تێیدا

دادەبەزێ بۆ حوكم و دادوەریكردن لەنێوانتان، جا ڕەنجەڕۆ و خەسارەتمەند بووە ئەو كەسەی لە ڕەحمی الله تعالى بێ بەش بووبێ و بەهەشتی لێ حەرام كرابێ كە بەهەشت پانتاییەكەی بە قەدەر ئاسمانەكان و زەوییە، وە كەمێكی كڕی بە زۆر - واتە بەهەشتی گۆڕیەوە بەدونیا -, وە لە ناوچوویەك بە مانەوەی هەتا هەتایی، وە ترس و بیم بە ئەمن و ئاسایش، ئایا نابینن كەوا ئێوە لە شوێنی لە ناوچووەكانن - باب و باپیرانتان - , وە لە دوای ئێوە ئەوەی ماون شوێنتان دەگرنەوە - نەوەكانتان - , بەو شێوە هەتا دەگەڕێنەوە بۆلای باشترینی میراتگران, لەهەموو شەو و ڕۆژێكدا كاردەكەن بە هەواو ئارەزوویان ئێوارەكەش دەگەڕێنەوە بۆ لای الله تعالى ئەوە تەواو بوو كە حەزیان پێی بوو, وە ئەجەلیشیان تەواو بوو, هەتاوەكو دەیشارنەوە لە چاڵێك لە زەوی، لە ناو ناوەوە و قوڵایی چاڵێك، دوای ئەوە پاڵی دەدەنەوە و وازی لێدەهێنن بەبێ ڕاخەر و بالیف، هۆكارەكانی داكەندووە - ماڵ و سامان و جلوبەرگ - , وە لە خۆشەویستانی جیابووەتەوە، نیشتەجێی خۆڵ بووە، ڕووبەڕووی حساب و لێپرسینەوە بووەتەوە، ڕەهنداره بە زانستەكەی - وەڵامدانەوەی پرسیارەكان - ، هەژارە بۆئەوەی پێشی خستووە، دەوڵەمەندە لەوەی جێیهێشتووە، جا لە الله تعالى بترسن پێش دابەزینی مردن .

سوێند بە الله تعالى من كە ئەو قسانەتان بۆدەكەم، نازانم لەلای یەكێك لە ئێوە گوناح و تاوان هەبێ وەك ئەوەی دەزانم كە لەلای منە،

وەكاتێ لە یەكێك لە ئێوە  پێویستییەكم پێدەگات ئیللا پێم خۆشە بۆی جێبەجێ بكەم بەئەندازەی ئەوەی لە توانامدا هەیە، وە كاتێ پێم دەگات كە یەكێك لە ئێوە بەشی ناكات لەوەی كە لەلای منە ئیللا حەزم كردووە لەتوانامدا هەبێ بۆی بگۆڕم هەتا ژیانی بگاتە ئاستی ژیانی ئێمە .

وە سوێند بە الله تعالى ئەگەر جگە لەوەم ویستبا لە دەوڵەمەندی و ژیانی خۆش ئەوا زمانم بەهۆیەوە زەلیل و زانا دەبوو بە هۆكارەكانی، بەڵام كتابێكی قسەكار لەلایەن الله تعالى پێشكەوتووە، وە سوننەتێكی یەكسان و دادپەروەر، دەلالەتی كردووە لەسەر گوێڕایەڵیكردنی وە ڕێگری كردووە لە سەرپێچیكردنی .

دوای ئەوە لایەكی جلەكەی لەسەر دەم وچاوی دانا و گریا و هاواری كرد، وەخەڵكیش گریان، ئەوە كۆتا خوتبە و ووتاری بوو دای .

١٤ - صالح ی كوڕی حسان وتی : ئیمامی عمری كوڕی عبدالعزیز ناردی بەدوای تابعی بەڕێز محمدی كوڕی كعب القُرظي، پێی وت : یەكسانی و دادپەروەریم بۆ وەسف بكە .

محمدی كوڕی كعب وتی : بخ - بۆ مدحی پرسیارەكەی بەكارهێناوە - ، لە بابەتێكی زۆر چاك پرسیارت كرد .

بۆ بچووکی مسوڵمانان ببە باوک، وە بۆگەورەکانیان کوڕ، وە بۆ هاوتەمەنی خۆت برا .

وە سزای خەڵکی بدە بە ئەندازەی تاوانەکانیان، بە ئەندازەی لاشەیان - تا چەند بەرگەی ئەشکەنجە دەگرن - ، لەبەر تووڕەبوونی خۆت یەك قامچی لە کەس مەدە، ئەوکاتە سنوور دەبەزێنی و لە لای الله تعالی لە سنوور بەزێنەران دەبیت .

**١٥** - کەسێکی متمانە پێکراو بۆی گێڕاینەوە : کەوا عمری کوڕی عبدالعزیز نوسی بۆ أبوبکری کوڕی محمدی کوڕی عمروی کوڕی حزم :

أمّا بعد :

بێگومان تۆ نووسراوانێکت نووسیوە بۆ سولەیمان - خەلیفەی پێش خۆی - ، کە سەیری هیچیانی نەکردووە هەتا مردووە ڕەحمەتی الله ی لێبێت، وە من تاقیکراومەتەوە بە وەڵامدانەوەت، جا گوێبگرە :

نووسیوتە بۆ سولەیمان کەوا ئەو برپویەتیەوە بۆ کرێکارانی شاری مەدینە لە خەزێنەی مسوڵمانان بۆ نرخی مۆمانێك کە بەکاری دێنن بۆ ڕووناککردنەوە کاتێ دەردەچن بۆ نوێژی عیشا و نوێژی بەیانی، وە دەڵێ ئەو جێبەجێی کردووە ئەوەی کەوا پێی ڕووناك دەکردەوە، وە داوا دەکەی

بۆت ببڕتەوە لە نرخەکەی هاوشێوەی ئەوەی کەوا بڕیویەتیەوە بۆ کرێکارەکان .

وە بێگومان بەڵێنم پێ دابوویت وە تۆ دەردەچیت لە ماڵەکەت لە شەوێکی تاریکی باراناوی قوڕ و قوڕاو بەبێ ڕووناکی، سوێند بێت بۆتۆ ئەو ڕۆژە باشترە بۆت لەمڕۆ - واتا پاداشتەکەی زیاترە، والله اعلم - ، والسلام .

١٦ - لە ئەوزاعی ەوە، وتی : هەموو ڕۆژێك عمری کوڕی عبدالعزیز درهەمێکی لە ماڵی تایبەتی خۆی دەکردە ناو خواردنی گشتییەوە، دوای ئەوە لەگەڵیان نانی دەخوارد .

ئەوزاعی وتی : عمر نانی نەدەخوارد بەبێ مسوڵمانان .

١٧ - لە مجاهد ەوە، وتی : مەهدییەکان حەوتن، پێنجیان ڕۆیشتن، وە دوان ماون ..

خارجە وتی : أبو بکر، وە عمر، وە عثمان، وە عەلی، وە عمری کوڕی عبدالعزیز، رضي الله عنهم ،

١٨ - قەبیسە ی کوڕی عقبە وتی : بیستم سوفیان الثوری دەیوت : جێنشینەکان پێنجن : أبو بکر، وە عمر، وە عثمان، وە علي، وە عمری کوڕی عبدالعزیز رضي الله عنهم .

١٩ - لە عباس ی کوڕی باوکی ڕاشد ەوە، وتی : عمری کوڕی عبدالعزیز هات بۆ لامان، کاتێ ڕۆیشت گەورەکەم پێی وتم : برۆ لەگەڵی هاوەڵیەتی بکە،

عباس وتی : دەرچووم لەگەڵی و بە دۆڵێکدا تێپەڕین، لەوکاتەدا مارێکی مردوومان بینی لەسەر ڕێگا،

عباس وتی : ئیمامی عمر لەئەسپەکەی دابەزی و دووریخستەوە و شاردیەوە، پاشان سواربوویەوە و ڕۆیشتین، لەو کاتەدا گوێمان لە بانگکارێ بوو هاواری دەکرد و دەیوت : ئەی خرقاء، ئەی خرقاء .

عباس وتی : ئاوڕمان دایەوە بەلای ڕاست و چەپدا کەسمان نەبینی .

عمر وتی : بۆ خاتری خوای گەورە داوات لێدەکەم ئەی بانگکار ئەگەر تۆ لەوانەی بەدەردەکەوی ئەوا خۆت دەربخە، ئەگەرنا پێمان بڵێ الخرقاء چییە؟

بانگکارەکە وتی : ئەو مارەی لە فڵانە شوێن شاردتانەوە، بێگومان من لە رسول الله ﷺ بیستم ڕۆژێك پێی دەوت : (ئەی خرقاء، لە پانتاییەکی زەوی دەمریت، چاکترین ئیمانداری ئەو ڕۆژە لەسەر زەوی دەتشارێتەوە) .

جا عمر پێی وت : تۆ کێی ڕەحمەتی الله ـت لێبێ؟

بانگکارەکە وتی : من لەو نۆیەم کەوا بەیعەتیاندا بە رسول الله ﷺ لەو دۆڵەدا .

عمر پێی وت : سوێندت ئەدەم بە الله کە تۆ ئەوەت بیستووە رسول الله ﷺ ؟

بانگدەرەکە ووتی : سوێند بە الله لە رسول الله ﷺ بیستوومە .

جا فرمێسك لە هەردوو چاوی عمر هاتە خوارەوە، وە ڕۆیشتین .

**٢٠ - زیاد** ی کوڕی باوکی **زیاد** ، وتی : گەورەکەم - کوڕی عیاش کوڕی باوکی ڕەبیعە - منی نارد بۆ لای عمری کوڕی عبدالعزیز بۆ چەند پێداویستییەك بۆی،

زیاد وتی : چوومە ژوورەوە بۆلای، ئیمامی عمر نووسەرێکی لابوو بۆی دەنووسی، جا وتم : السلام علیکم .

عمر وتی : وعلیك السلام .

پاشان تەواوم کرد، دووبارە وتم : السلام علیکم ئەی پێشەوای ئیمانداران ورحمة الله .

عمر وتی : ئەی کوڕی باوکی زیاد، ئێمە ئینکاری ئەوەی یەکەممان نەکرد کە ووتت .

پاشان پێی وتم : دابنیشە، وە نووسەرەکە ئەو سکاڵایانەی بۆ دەخوێندەوە کە لە بەسرەوە بۆی هاتبوو، پێی وتم : دابنیشە، جا لە لای دەرگاکە دانیشتم، وە نووسەرەکەش لەسەری دەخوێندەوە، وە عمر هەناسەی هەڵدەکێشا، کاتێ لێبوویەوە ئەوەی لەماڵەکە بوو دەریکردن هەتا خزمەتکارەکەشی، پاشان هەستا هات بۆلام هەتا لەبەرامبەرم دانیشت، وە هەردوو دەستی دانا لەسەر هەردوو ڕانم .

پاشان وتی : ئەی کوڕی باوکی زیاد، بە جلەکەت خۆم گەرم کردەوە وە منیش جلێکی سوفم لەبەر بوو، وە ئیسراحەتم کرد لەوەی ئێمە تێیداینە، زیاد وتی : جا پرسیاری لێکردم لە (صلحاء) ی خەڵکی مەدینە و پیاوان و ئافرەتانیان، زیاد وتی : وە هیچ یەکێك لەوان نەما ئیلا هەواڵی لێم پرسی، وە پرسیاری لێکردم لەبارەی چەند بابەتێك کە فەرمانی پێکردبوو بۆ مەدینە، جا هەواڵم پێدا .

دوای ئەوە پێی وتم : ئەی کوڕی باوکی زیاد، ئایا دەبینیت ئەوەی کە تێی کەوتووم؟

زیاد دەڵێ، وتم : ئەی پێشەوای ئیمانداران، بەڕاستی هیوام وایە خێری تێدابێ بۆت .

عمر وتی : هەی هوو هەی هوو، زیاد وتی : پاشان گریا هەتا منیش دەستم کرد بە گریان بۆی .

زیاد دەڵێ وتم : ئەی پێشەوای ئیمانداران، هەندێك لەو کارانەی کەوا دەیکەیت هیوام وایە خێری تێدابێ بۆت .

عمر ووتی: هەی هوو هەی هوو، جنێو بدەم و جنێوم پێنەدرێ، لێبدەم و لێم نەدرێ، ئازار بدەم و ئازار نەدرێ، پاشان گریا هەتا منیش دەستم کرد بە گریان بۆی، زیاد وتی : وە هەڵمستاندەوە هەتا پێویستیەکانم بۆ جێبەجێ بکات، وە بۆ گەورەکەمی نووسی داوای لێکرد کە من بفرۆشێت بەو - عمر - ، پاشان لە ژێر فەرشەکی بیست دیناری دەرهێنا، جا عمر وتی : ئەوە بەکاربهێنە، بێگومان ئەگەر لە فيء (دەستکەوت) دا مافت هەبووایە ئەوا پێماندەبەخشیت، بەڵام تۆ بەندەیت، زیاد دەڵێ : نکۆڵیم کرد لەوەی بیبەم، جا عمر وتی : بەڕاستی ئەوە بژێوی خۆمە، عینادی لەگەڵ کردم هەتا وەرم گرت، وە بۆ گەورەکەمی نووسی کە پێم بفرۆشێت، جا گەورەکەم نکۆڵی کرد، وە ئازادی کردم - واتە بەبێ ئەوەی بیفرۆشێتە ئیمامی عمر، والله أعلم - .

**٢١** - عمر ی كوڕی صالح ی الأزدي دەڵێت : بیستم شێخێك لە خەڵكی شام وتی : كاتێ عمری كوڕی عبدالعزیز وەفاتی كرد رحمه الله، سندوقێكی بە ئەمانەت دانابوو لەلای یەكێك لە خزمەتكارەكانی، هێنایان و پێیان وت : ئەو سندوقەی كە عمر بە ئەمانەت پێیدابووی .

خزمەتكارەكە وتی : خێری بۆ ئێوە تێدا نییە .

ئەوانیش نكۆڵیان كرد هەتا ئەو باسەیان بەرزكردەوە بۆلای یەزیدی كوڕی عبدالملك، ئەویش ووتی سندوقەكەم بۆ بهێنن، وە بانگی بەنی ئومەییەشی كرد .

یەزید وتی : سندوقێكی زانایەكەتانمان دۆزیوەتەوە، كەسێكی ئەمانەت پارێز پاراستبووی، وتی بیهێنن، بۆیان هێنا و كردیانەوە، بینیان كەوا پارچە قوماشانێك - كە لە موو دروستكرابوون - بە شەو لەبەری دەكردن تێیدابوو .

**٢٢** - یونس ی كوڕی جعفر الرقي بۆی گێڕاینەوە : كەوا عمری كوڕی عبدالعزیز نووسی بۆ سالمی كوڕی عبد الله ی كوڕی عمری كوڕی خطاب :

أمّا بعد :

جا بێگومان الله تعالی تاقیكردمەوە بەوەی پێی تاقیكردوومەتەوە لە بەڕێوەبردنی بەندەكانی و شارەكانی، یارمەتیم بدات، وە كۆتاییم خێر

بكات، وه عاقیبه‌ت و ئاخیره‌تی ئه‌و كه‌سه‌ی كه من ڕابه‌رایه‌تی ده‌كه‌م، وه بێگومان بینیوته كه‌وا من به‌ناو خه‌ڵكیدا ده‌گه‌ڕێم و به‌ڕێوه‌یان ده‌به‌م به‌ڕێگه‌ی (وه‌كو) عمری كوڕی خطاب ئه‌گه‌ر الله تعالى بڕیار بدات و ویستی له‌سه‌ر بێت، وه له توانامدا هه‌بێ .

جا نووسراو و بڕیاره‌كانی عمرم بۆ بنێره له‌باره‌ی ئه‌هلی قیبله - مسوڵمانان - ، وه به‌ڵێن پێدراوه‌كان، چونكه به‌ڕاستی من شوێن پێی ئه‌و ده‌كه‌وم و وه به ڕێگه‌ی ئه‌ودا ده‌ڕۆم إن شاء الله، وه داوای ته‌وفیق و یارمه‌تی ده‌كه‌م له الله تعالى بۆ ئه‌وه‌ی كه‌وا خۆشی ده‌وێت و پێی ڕازییه .

**٢٣ -** هه‌ر له **یونس** ـه‌وه ده‌فه‌رموێ كه‌وا سالم وه‌ڵامی داوه‌ته‌وه فه‌رمووی :

أمّا بعد :

جا بێگومان الله تعالى دونیای دروست كردووه بۆ ئه‌وه‌ی ویستوویه‌تی دروستی بكات بۆی، جا كاتێكی كورتی بۆ گێڕاوه و داناوه، وه‌كو ئه‌وه‌ی ماوه‌ی نێوان سه‌ره‌تا و كۆتاییه‌كه‌ی سه‌عاتێك بێت له‌ڕۆژدا، پاشان بڕیاری داوه له‌سه‌ر دونیاو ئه‌هله‌كه‌ی به له‌ناو چوون، فه‌رمووی : (**وَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥۚ لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ**)

[**القصص : ٨٨**] .

واته : هەموو شتێك تیا دەچێت جگە لە ڕووخساری پیرۆزی الله تعالى نەبێ

.

خەڵکەکەی توانایان نابێت تێیدا لەسەر هیچ شتێك ئەی عمر تاوەکو لێیان جیادەبیتەوە و ئەوانیش لێی جیادەبنەوە، الله تعالى نێردراوەکانی بەوەوە ناردووە و کتابە پیرۆزەکانی دابەزاندووە کە نموونەکانی تێدا هێناوەتەوە و ترساندنەکانی تێدا باسکردووە، وە بەهۆیەوە ووتەکەی گەیاندووە، دین و بەرنامەکەی خۆی تێدا باسکردووە، وە حەڵاڵی تێدا حەڵاڵ کردووە و حەڕامی قەدەغە کردووە، وە هەواڵی گەلانی پێشووی بە جوانترین شێوە گێڕاوەتەوە و باسکردووە، وە دینەکەی - ئیسلام - لە سەرەتا و کۆتایی کردووە بە یەك دین و جیاوازی نەکردووە لە نێوان کتابەکانی و نێردراوەکانی، وتەی خۆی نەگۆڕیوە، پاشان تۆ ئەی عمر دژایەتی ئەوە ناکەی کەوا تۆش یەکێکی لە نەوەی ئادەم، بەسە بۆت ئەوەی بەسە بۆ پیاوێك لەوان لە خواردن و خواردنەوە، ئەو فەزڵەی لەنێوان و خۆت و پەروەردگارت هەیە ئەوا بە شوکرانە بژێری بۆئەو نیعمەتانە بەرەو ڕووی ببە، بەڕاستی تۆ کارێکی گەورەت پێ سپێردراوە هیچ کەسێکت لەسەر نییە - چاودێر نییە - جگە لە الله تعالى، وە بێگومان ڕوون و ئاشکرایە ئەوەی لە نێوان تۆ و لە نێوان خەڵکی دایە، ئەگەر بتوانی خۆت و خێزانەکەت دەوڵەمەند بکەی و لە قیامەتیشدا خۆت و خێزانەکەت زەرەرمەند نەکەیت ئەوا بیکە، چونکە

بەڕاستی لە پێش تۆ پیاوانێك هەبوو كردیان ئەوەی كەوا كردیان، وە زیندوویان كردەوە ئەوەی كەوا زیندوویان كردەوە، وە مراندیان ئەوەی كەوا مراندیان، هەتاوەكو پیاوانێك لەو نێوانەدا لەدایك بوون و گەورەبوون تیایدا، وە واگومانیان برد كەوا ئەوا سوننەتە، جا دایانخست لەسەر خەڵكی دەرگاكانی خۆشگوزەرانی، بۆیە دەرگایەكیان دانەخست لە دەرگای خۆشگوزەرانی ئیللا الله تعالی دەرگایەكی بەڵا و ناخۆشی لەسەر كردنەوە لە بەرامبەردا، جا ئەگەر توانیت وە هیچ هێزێك نییە ئیللا بە الله تعالی نەبێت كەوا دەرگای خۆشگوزەرانی بكەیتەوە بەسەر خەڵكیدا ئەوا بیكە، چونكە بێگومان دەرگایەكی خۆشگوزەرانی ناكەیتەوە ئیللا لەبەرامبەردا الله تعالی دەرگایەكی بەڵا و ناخۆشیت لەسەر دادەخات، وە كەمی كرێكار ڕێگریت لێ ناكات كەوا بڵێی: نادۆزمەوە ئەوەندەی بەشم بكات كارەكانمی پێ ڕایی بكەم، چونكە بەڕاستی تۆ ئەگەر دەترسیت لە الله تعالی، وە كار دەكەیت بۆ الله تعالی، ئەوا الله تعالی یارمەتیدەرانێكت پێ دەبەخشی كەوا تۆ بیانهێنی - كاریان پێ بسپێری والله اعلم - ، وە بێگومان ئەندازەی یارمەتیدانی الله تعالی بۆتۆ بە ئەندازەی نیەتەكەتە، جا ئەگەر نیەتەكەت تەواو و كامل بێ بۆ الله تعالی ئەوا یارمەتیدانی الله تعالی ش تەواو و كامل دەبێ بۆتۆ، وە ئەگەر لە نیەتەكەت كەم ببێتەوە، یارمەتیدانی الله تعالی ش كەم دەبێتەوە بۆ تۆ بە ئەندازەی ئەوە.

وە بزانە پێش تۆ کەسانێك هەبوون کەوا ترس و بیمی ئاگاداریان - مردن والله اعلم - بە چاوی خۆیان بینی، وە ناخۆشیەکانی مردنیان چەشت ئەوەی کەوا ڕایاندەکرد لێی، جا سکەکانیان لەت بوو ئەوەی کەوا پێی تێر نەدەبوون، وە ئەو چاوانەی کەوا چێژی سەیرکردنەکەی نەدەبڕایەوە تەقین و دەرپەڕین، وە ملەکانیان شکا بەبێ سەرین دوای ئەوەی دەزانیت لە لابردنی فەرش و بالیف و قەنەفە و خزمەتکار جا خرانە ناو سکی زەوی و نیشتەجێی ژێر خاك بوون، سوێند بە الله تعالی ئەگەر لە تەنیشت بۆنی میسکیش بن ئەوا ئازار دەچێژیت بەهۆی بۆنەکەیان دوای خەرجکردنی ئەوەی ناژمێردرێ لە پارە بۆیان وە لە تایبەتترینیان لە بۆنی خۆش، هەموو ئەوە زیادەڕۆیی و پەلە کردنە لە حەق و مافی الله تعالی، جا ئێمە هی الله ین و بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە، چەند گەورەیە ئەوەی پێی تاقیکراویتەتەوە، وە ترسناکترین تاقیکردنەوەیە کە هاتووە بۆلای تۆ .

خەڵکی عێراق، خەڵکی عێراق، ئەو کەسانە باشترین پێگەیان هەیە لای تۆ کە پێویستی بە تۆ نییە، وە پێویستی بە تۆ نییە، جا تۆ هەرکەسێکت نارد لە کرێکارەکانت - کاربەدەست - بۆ عێراق ئەوا ڕێگری لێ بکە بەتوندی هاوشێوەی سزا لە بردنی ماڵ و سامان، وە ڕشتنی خوێن تەنها بە حەقی خۆی .

ماڵ ماڵ ئەی عمر وە خوێن، چونکە بێگومان هیچ دەربازبوونەکت نییە لە سزای دۆزەخ کاتێ کە زوڵمی کاربەدەستێکت پێدەگات دوای ئەوە

نەیگۆڕی، وە بەڕاستی ئەو کەسەی ناردووتە لە کاربەدەستەکانت کەوا کاربکەن بە سەرپێچی الله تعالی، یان بە گومان حوکم جێبەجێ بکەن، وە یان دەست بەسەر کڕین و فرۆشتنی مسوڵمانان دابگرن جا بەڕاستی تۆ ئەگەر بوێر بوویت. ڕێگریت لێ کرد. لەسەر ئەوە دەهێنرێ بۆ لای تۆ لە ڕۆژی دوایی بە سەرشۆڕی و بچووکی، وە ئەگەر دوورت خستەوە لێی ئەوا ئاسوودەییەکەی دەدۆزیتەوە لە بیستنت و بینینت و دڵت.

نووسیوتە داوام لێ دەکەی کەوا کتێبەکان و بڕیارەکانی عمرت بۆ بنێرم دەربارەی ئەهلی قیبلە. مسوڵمانان. وە بەڵێندراوەکان، وە بێگومان عمر کاری کردووە لە جگە لە سەردەمی تۆ، وە کاری کردووە بە جگە لە پیاوانی تۆ، وە بەڕاستی تۆ ئەگەر کاربکەیت لە سەردەمی خۆت لەسەر ئەو شێوەی کەوا ئیمامی عمر کاری کردووە لە سەردەمی خۆی دوای ئەوەی کە بینیوتە وە تاقیکراویتەتەوە هیوام وایە پێگەت باشتر بێت لەلای الله تعالی لە عمری کوڕی خطاب - والله اعلم مەبەستی پاداشتە لەلای الله واتا سەردەمی تۆ قورسترە ئەم کارانە، نەک مەبەستی ئەوە بێت کە تۆ لە عمر بن الخطاب باشتر بیت - .

جا بڵێ هەروەکو چۆن بەندەی چاك وتی : (**وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ**) [هُود]

واتە : خۆ تەوفیق و دۆزینەوەی ڕێی ڕاست و هیدایەتیشم تەنها بە اللە یە پشتم بەو بەستووە و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە .

**٢٤** - **محمد** ی کوڕی **کعب** ی **قرظی** وتی : پەیمانمدا بە عمری کوڕی عبدالعزیز وە ئەو ئەمیر بوو لەسەرمان لە شاری مەدینە بۆ وەلیدی کوڕی عبدالملك، وە ئەو عمری کوڕی عبدالعزیز گەنجێکی پتەو و لاشەپڕ بوو .

جا کاتێ خەلافەتی وەرگرت هاتم بۆلای لە خناصرە و چوومە ژوورەوە، ئازارێکی زۆری هەڵگرتبوو، بینیم حاڵی زۆر گۆڕابوو لەچاو پێشووتر وەکو جاران نەمابوو، سەیرکردنێك سەیرم دەکرد نەمدەتوانی چاوم لاببەم لەسەری، جا عمر وتی : بەڕاستی تۆ تەمەشاکردنێك تەمەشام دەکەیت کەوا پێشتر ئاوا تەمەشامت نەدەکرد ئەی کعب !

کعب وتی : سەیرم بە تۆ دێت ئەی پێشەوای ئیمانداران!

عمر وتی : سەیرت بە چی دێت؟

کعب ووتی: لەوەی ڕەنگت گۆڕاوە، وە مووت ڕۆیشتووە و نەماوە، وە لاشەت نەخۆش و لاواز بووە .

عمر ووتی: جا چۆنە ئەگەر بمبینی لەناو گۆڕەکەم دوای سێ ڕۆژ ئەی کوڕی کعب،کاتێ بیلبیلەی چاوم دەکەوێتە سەر ڕوومەتم، وە دەم و ددانەکانم کێم و کرم لێی دەدا، ئەوکاتە زۆر بێزم لێدەکەیتەوە - ئەگەر

ئەوا بمبینی - ، پاشان وتی : ئەو فەرموودەیەم بۆ بگێڕەوە دووبارە کە گێڕایتەوە لە عبداللەی کوڕی عەباسەوە رضي الله عنهما .

کعب وتی : بەڵێ باشە، بۆی گێڕاینەوە عبداللەی کوڕی عباس، کەوا رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی بۆ هەموو شتێك رێز و شەرەف هەیە وە بەڕاستی رێز و شەرەفی مەجلیس و دانیشتنەکان ئەوەیە ڕووبکرێتە قیبلە، وە بێگومان دادەنیشن بە ئەمانەتەوە، وە نوێژ مەکەن لەدوای نووستوو و قسەگێڕەرەوە، وە مار و دووپشك بکوژن ئەگەر چی لەناو نوێژیشدا بوون، وە دیوارەکان دامەپۆشن بە بەرگ و پۆشاك، وە بەوکەسەی سەیری کتابی براکەی بکات بەبێ ئیزنی ئەو ئەوە بەڕاستی سەیری ناو ئاگر دەکات، وە ئەوەی پێی خۆشە ببێتە رێزدارترینی خەڵکی ئەوا با لە الله تعالی بترسێت، وە ئەوەی پێی خۆشە کەوا ببێتە دەوڵەمەندترینی خەڵکی ئەوا با زیاتر سیقەی هەبێ بەوەی کەوا لە ناو دەستی الله تعالی دایە لەوەی کەوا لە ناو هەردوو دەستی خۆیتی) .

**٢٥ - عبدالله** ی کوڕی **بکر** وتی : شەیخێك لە بنی سولەیم بۆی گێڕامەوە کەوا عمری کوڕی عبدالعزیز هیشامی کوڕی مصادی لە لا بوو، عبد الله کوڕی بکر دەفەرموێ : وابزانم بەیەکەوە قسەیان دەکرد، عمر باسی شتێکی کرد و جا گریا، خزمەتکارەکەی مزاحم هات بۆلای و پێی وت : بەڕاستی محمدی کوڕی کعبی القرظي لەبەردەرگایە، عمری کوڕی

عبدالعزيز وتی : بابێته ژوورەوە، محمدی کوڕی کعب هاتە ژوورەوە وە عمر فرمێسکی چاوەکانی دەسڕی .

محمدی کوڕی کعب پێی وت : چی تۆی گریاند ئەی پێشەوای ئیمانداران؟!

جا هیشامی کوڕی مضاد پێی وت : ئەوە و ئەوە گریاندی .

محمد وتی : ئەی پێشەوای ئیمانداران، بێگومان دونیا بازاڕێکە لە بازاڕەکان، خەڵکانێك دەرچوون لەناویدا بەوەی کەوا سوودیان پێ دەگەیەنێ، وە هەیانە دەرچوو لە ناویدا بەوەی زەرەری پێ گەیاندن، جا چەند کۆمەڵانێك هەبوون کە غروور گرتنی تێیدا وەکو ئەوەی کەوا بەیانیمان کردەوە هەتا مردن بۆیان هات، جا سەرکۆنەو عەیبداری کردن، وە دەرچوون لێی بە زەمکراوی، هیج زەخیرەیەك کەوا پێیان خۆش بوو هەیانبی لە ڕۆژی دوایی لەگەڵ خۆیان نەیانبرد، وە نە قەڵغانێك و پاراستنێك لەوەی کەوا ڕقیان لێی بوو، وە دابەشیکرد ئەوەی کۆیانکردبووەوە ئەو کەسەی کەوا سوپاسی نەدەکردن، وە ڕۆیشتن بۆلای ئەو کەسەی کەوا عوزریان پێ نادات، جا ئێمە لەسەرمانە ئەی پێشەوای ئیمانداران کەوا تەماشای ئەو کاروکردەوانەیان (لە چاکە) بکەین کە حەسوویان پێ دەبەین تێیدا شوێنیان بگرینەوە تێیدا، وە تەمەشای ئەو کاروکردەوانەیان (لە خراپە) بکەین کە دەترسین لەسەریان (لە سزا) تێیدا وازی لێبهێنین و دەستی لێبگرینەوە .

جا له الله تعالى بترسه ئەی پێشەوای ئیمانداران، دەرگاکان بکەرەوە،وە پەردەکان هەڵبدەوە، وە ستەملێکراو سەربخە، وە وەڵامی سکاڵاکان بدەوە .

پاشان محمدی کوڕی کعب وتی : سێ تایبەتمەندی لە هەرکەسێکدا هەبێت ئیمانی پێ کامل دەبێت بە الله تعالى :

ئەو کەسەی ئەگەر ڕازی بوو ئەوا ڕازیبوونەکەی نایخاتە ناو باتڵەوە .

وە ئەگەر تووڕەبوو ئەوا تووڕەبوونەکەی دەری ناخات لە حەق .

وە ئەگەر توانای هەبوو ئەوا ئەو شتە بەدەست ناهێنێ و قۆرخی ناکات کە هی خۆی نییە .

**٢٦** - میمون ی کوڕی میهران وتی : بەڕاستی الله تعالى بەڵێنی وەردەگرت لە خەڵکی بە پێغەمبەرێك لە دوای پێغەمبەرێك، وە بێگومان الله تعالى بەڵێنی وەرگرت لە خەڵکی بە عمری کوڕی عبدالعزیز .

**٢٧** - لە میمون ی کوڕی میهران وتی : عمری کوڕی عبدالعزیز دەسەڵاتی پێدام لەسەر زەوی، جا پێی وتم : ئەگەر کتاب و نامەی منت بۆهات بە ناحەق ئەوا بە دیواری دابدە - واتە کاری پێ مەکە والله اعلم - .

٢٨ - محمد ی كوڕی حمزه وتی : كەسێكی جێی متمانە بۆی گێڕاینەوە كەوا عمری كوڕی عبدالعزیز نووسی بۆ عدی كوڕی أرطات :

أمَّا بعد :

جا بەڕاستی من نامانێكی زۆرم نووسیوە بۆت بەهۆیەوە هیوام وایە الله تعالی چاكە و پاداشتم بداتەوە، وە ڕێگریت لێدەكەم تێیدا لە كارەكانی حجاجی كوڕی یوسف، وە تەمەننا دەكەم تێیدا وە لە شوێنكەوتنت بۆی - ئەو نامانەی كە لە عومەرەوە بۆ دەهات، والله اعلم - ، چونكە بێگومان حجاج بەڵایەك بوو موافەقەی هەڵەی قەومێك بوو بەهۆی كردەوەكانیان، جا گەیشتە الله تعالی لە ماوەی مانەوەكەیدا ئەوەی ویستوویەتی، پاشان ئەوە پچڕا و نەما، وە پاراستن و سەلامەتی الله تعالی ڕووی تێكرد، ئەگەر ئەوە نەبووایە تەنها یەك ڕۆژ نەبی، یان یەك جومعە ئەوە لە بەخششێك دەبوو لە لایەن الله تعالی وە، وە بنچینەیەكی گەورەیە .

وە ڕێگریم لێكردی لە كارەكانی لە نوێژدا، چونكە بەڕاستی ئەو - حجاج - دوایدەخست دواخستنێك كەوا دروست نەبوو بۆی .

وە ڕێگریم لێكردی لە كارەكانی لە زەكات وەرگرتن چونكە بەڕاستی ئەو وەریدەگرت بە جگە لە حەقی خۆی، دوای ئەوە شوێنەكانی هەڵە دەكرد - واتە بەو شێوەیە دابەشی نەدەكرد كە الله تعالی دایناوە، والله اعلم - ، جا دووربكەوە لێی

لەو بابەتانە، وە ئاگاداری کارکردن بە پێی، بەڕاستی الله تعالی ئیسراحەتی بەخشی بە مسوڵمانان - بە مردنی حجاج - ، وە بەندەکانی و شارەکانی پاك کردەوە لە شەڕ و خراپەی .

والسلام .

**٢٩** - عدي کوڕی أرطاة نامەیەکی بۆ عمری کوڕی عبدالعزیز نوسی : لە عدي کوڕی ارطاتەوە :

أمَّا بعد :

الله تعالی پێشەوای باوەڕداران چاك بکات، جا بێگومان پێش من کۆمەڵێکی زۆر لە کرێکارەکان ماڵ و سامانێکی زۆریان بۆخۆیان بڕیبووەوە لە ماڵی - زەکات - الله تعالی نەمویست لە دەستیان دەربهێنم هەتاوەکو تووشی شتێك لە سزایان دەکەم، ئەگەر پێشەوای ئیماندارانی الله تعالی چاکی بکات ڕێگەم پێبدات بەو کارە بیکەم .

جا عمری کوڕی عبدالعزیز وەڵامی دایەوە :

أمَّا بعد :

بەڕاستی سەیرە بە هەموو سەرسوڕمانیەك داوام لێ دەکەیت ڕێگەت بدەم بە سزادانی ...

**٣٠** - ئەبو **صالح** نووسەری **ليث** ی كوڕی **سعد** بۆی گێڕاینەوە وتی : نامەی حەسەنی كوڕی باوكی حەسەنم وەرگرت لە ليثی كوڕی سعد بۆ لای عمری كوڕی عبدالعزيز ڕەحمەتی الله يان لێبێت :

أمَّا بعد :

بزانە ئەی پێشەوای ئیمانداران كەوا دونيا ماڵی نەمان و ڕۆیشتنە، وە ماڵی مانەوە نییە، وە بێگومان ئادەم دابەزێنرايە خوارەوە بۆی - زەوی - بە سزا، وە بەڕاستی ئەو كەسەی كەوا نازانێ پاداشتی الله تعالی چییە؟

وا حیساب دەكات كەوا ئەوە پاداشتە، وە ئەو كەسەی نەیزانیوە سزای الله تعالی چییە؟ وا گومان دەبات كە ئەوە سزايە .

وە لە هەموو كاتێكدا حاڵەتێكی هەیە، وە حاڵەتێك وەكو حاڵەتەكەی تر نییە .

لە دونيا بێ ڕێز دەبێ و گاڵتەی پێدەكرێ تێیدا ئەو كەسەی كە بەڕێزترینیان بوو، وە زەلیل و بێ دەسەڵات دەبێ ئەوەی دەسەڵاتدارترینیان بوو، وە ڕاكە ڕاكە و پێشبڕكێ دەكات ئەو كەسەی كە هەڵیبژاردووە - واتە دونيای هەڵبژاردووە - ، وە لە هەموو كاتێكدا كوژراوێكی تێدا هەیە .

جا ئەو - دونيا - وەكو ژەهر وايە، ئەو كەسەی ناينانسێ دەيخوات، وە مردن و لەناوچوونی تێدايە .

جا زوهد كردن تێیدا وازلێهێنانیەتی، وە دەوڵەمەندی تێیدا هەژاریەتی .

جا لە دونیادا بە ئەی پێشەوای ئیمانداران وەكو ئەوكەسەی كەوا چارەسەركاری برینەكەیەتی، ئارام دەگرێ لەسەر قورسی دەرمان و چارەسەر لەترسی درێژبوونەوەی بەڵاو موسیبەتەكە، خۆی دەپارێزێ و بەرگە دەگرێ كەمێك لەترسی درێژی ئەو شتەی كەوا پێی ناخۆشە و ڕقی لێیەتی .

بەڕاستی كۆمەڵەی چاكە و فەزڵەكان بیركردنەوەیان تێیدا بە پێكانە، وە ڕۆیشتنیان بە مامناوەندی و بێفیزە، وە خواردنیان لە ڕزق و ڕۆزی پاك و خاوێنە، چاوەكانیان داخراوە لە سەیركردنی حەڕامكراوەكان، وە ترسانیان لە وشكانی وەكو ترسانیانە لە دەریادا - مەبەستی لە ئاوەدانی و چۆڵەوانیدایە، والله اعلم - ، وە دوعا و پاڕانەوەیان لە خۆشیدا وەكو دوعا و پاڕانەوەیانە لە ناخۆشیدا، ئەگەر ئەو كات و ئەجەلە نەبوایە كەوا نووسراوە لەسەریان ئەوا ڕۆحەكانیان نەدەمایەوە لەناو لاشەیان لەترسی سزای الله تعالى، وە شەوق و ئارەزوویان بۆ پاداشتی الله عزَّوَجَل، دروستكاریان - الله تعالى - بە گەورە ڕاگرتووە لە ناخیاندا بۆیە دروستكراوەكان بچووك بوونەتەوە لە پێش چاویان .

وە بزانە ئەی پێشەوای ئیمانداران كەوا بیركردنەوە سەردەكێشێ بۆ چاكە، وە كاركردن پێی، وە پەشیمانبوونەوە لە خراپە و تاوان سەردەكێشێ بۆ وازلێهێنانی، ئەوكەسە دەوڵەمەند نییە ئەگەرچی ماڵ و

مندالّی زۆربێ کەوا ئەو دونیایە پێش بخات بەسەر ئەوەی کەوا دەمێنێتەوە - مەبەستی دونیایی کاتی پێش بخات بە بەهەشتی هەمیشەیی، واللە اعلم - ، ئەگەر چی داواکردنەکەی خۆشەویست بێ، وە ئارامگرتنی ڕزقێکی پچڕ پچڕ کەوا خۆشی و ئیسراحەتێکی هەمیشەیی بەدوادا دێ باشترە لە پێشخستنی خۆشیەکی پچڕ پچڕ کە بەدوای دادێ ڕزقێکی بەردەوام و پەشیمانبوونەوەیەکی درێژ .

جا وریای ئەو دونیا بەربەرەکانیکەرە ڕیسواکەرە بکوژە بە کەوا خۆی ڕازاندووەتەوە بە فێڵەکانی، وە کوشتویەتی بە غروور بوونەکەی، وە هەڵیخەڵەتاندووە بە هیواکانی، جا دونیا وەکو بووکێکی ئامادەکراوی لێهاتووە، چاوەکان لەسەر ئەون و بۆ ئەو دەڕوانن، وە دڵەکان بۆی شێت و سەرگەردان بوون - لە خۆشەویستیان بۆ دونیا - ، وە نەفسەکان عاشقی بووینە، وە ئەویش - واتە دونیا - بۆ هاوسەرەکانی هەر هەموویان بکوژە .

جا نە ئەوانەی ماون پەند و عیبرەتیان وەرگرتووە لەوانەی ڕۆیشتوون، وە نە ئەوانەی کۆتایی کە بینیان لەو شوێنەوار و پاشماوانەی سەرەتاکان گەڕانەوە و وازیان هێنا، وە نە کەسی خواناس کاتێ هەواڵی پێدرا بەو ئامۆژگاریە بەڕاستی خستەوە، جا دڵەکان نکۆڵیان کرد تەنها خۆشەویستی بۆی نەبێ، وە نەفسەکانیش ئینکاریان کرد تەنها عیشق بۆی نەبێ، وە نەفس عاشقی هەر شتێك بێ ئەمر و فرمان وەرناگرێ جگە لەو، وە تێناگات

لەهیچ شتێکی جگە لەو مردووە لە داواکردنی، وە ئەو شتانەی هەڵبژادووە کە لەلایەتی لە دونیادا بەسەر دوارۆژدا، جا هەردووکیان دوو عاشقی داواکاری تێکۆشەر و هەوڵدەرن، جا عاشقێك پێویستیەکانی بەدەستهێناوە تێیدا، جا غروور بووە و سنووری بەزاندووە و لەبیری چووە و سەرلێشێواو بووە، جا بێئاگا بووە لە دەستپێکی دروستبوونەکەی، وە سەرەنجامەکەی کە بۆی دەچێ ونی کردووە، وە کەمێك مایەوە لە دونیا هەتا پێی تێدا هەڵخلیسکا، وە ئاواتەکەی هات بۆلای لەسەر خراپترین حاڵەت، وە ئومێدی تێدا درێژ کردەوە، جا پەشیمانبوونەوەکەی گەورەبوو، وە ئاهـ و حەسرەتی زۆر بوو لەگەڵ چارەسەر نەبوونی سەرلێشێواویەکەی، جا کۆبوویەوە لەسەری سەختی مردن بە ئێش و ئازارەکەیەوە، وە حەسرەتی لەدەستدان گەرووی گرتووە، جا وەسف نەکراوە ئەوەی بەسەری هاتووە .

قوە کۆتاییەکەی : مردووێك مرد پێش ئەوەی ویستەکانی بەدەست بهێنێت، جا مرد بە خەم و خەفەتێکی زۆرەوە، وە نەگەیشت تێیدا ئەوەی داوای کردبوو، وە نەفسی ئیسراحەتی نەکرد لە ماندوویەتی ڕاکە ڕاکە، جا دەرچوون هەموویان بەبێ زاد و زەخیرە، وە ڕۆیشتن بەبێ جێی مانەوە .

جا ئاگاداربە هەموو ئاگاداریەك، چونکە بەڕاستی نموونەی دونیا وەکو نموونەی مارێکە، دەستلێدانی نەرمە، دەتکوژێت بە ژەهرەکەی .

جا پشت بكە لەوەی سەرسامت دەكات تێیدا - واتە لە دونیا - لەبەر كەمی ئەوەی هاوەڵێتیت دەكات تێیدا - واتە لە قەبر و قیامەت - ، وە خەم و پەژارەی دونیا دووربخەرەوە لەخۆت كە دڵنیاییت لە جیابوونەوەی .

وە قورسی ئەوەی قورس و گران بووە لەسەرت لە دونیا بكە خۆشی و ئارامی ئەوەی ئومێد دەكەی لە دوای ئەو - لە قیامەت - .

وە وریاتر بە لەوكاتانەی كە دڵخۆشی تێیدا زیاتر وەك لەوەی لەناخۆشیدای . چونكە كەسی دونیاوی هەركاتێ دڵنیابوو لە خۆشی و شادی لە دونیادا - وابزانێ بەردەوام دەبێ - ، هاوەڵێتی دەكات لە خۆشیەكەیدا ئەوەی پێی ناخۆشە .

وە هەموو كاتێ ئەوەی خۆشی دەوێت بەدەستی بهێنێ، هەڵدەگەڕێتەوە لەسەری بەوەی كەوا پێی ناخۆشە .

دڵخۆشكەر لەو بۆ ئەهلەكەی هەڵخەڵەتێنەرە - واتە ئەو شتەی ماڵی دونیا كە دڵخۆشكەرە لە ڕاستیدا بۆ ئەهلەكەی هەڵخەڵەتێنەرە - .

سودبەخشی ئەو سبەینێ بۆ ئەهلەكەی زیانبەخشە .

وە بێگومان خۆشی دونیا لكێندراوە بە بەڵاو موسیبەت، وە مانەوەكە تێیدا دروستكراوە بۆ لەناو چوون .

جا دڵخۆشیەکەی بە خەم م خەفەتەوە تێکەڵ بووە، وە ئەو خۆشییەی کە تێیدایە لەدەست چووە .

وە ئەی پێشەوای ئیمانداران تەمەشای دونیا بکە تەماشاکردنی کەسێکی زاهدی جیابووەوە - واتە لە دونی - ، وە تەمەشای دونیا مەکە وەکو تەمەشاکردنی کەسێك کە تاقیکیراوەتەوە بە عیشق و خۆشەویستی دونیا

.

وە بزانە کە دونیا ئەو کەسەی زۆر ماوەتەوە لادەبات بە کەسی تازە نیشتەجێ بوو لە دونیا، وە ئەوکەسەی لە خۆشگوزەرانیدایە تووشی بەڵا و موسیبەت دەبێت لەکاتێ کە لە ئەمن دابووە .

وە ئەوەشی ڕووی لێوەرگێڕا و پشتی لێکرد - واتە پشتی لە مردن کرد، والله اعلم - ، ئەوا ناگەڕێتەوە ناوی، وە پێویستە لەوەی کەوا هاتووە لە ناویدا چاوەڕێ بکات - واتە چاوەڕێی ئەو ناڕەحەتیانە بکات کە لەناو گۆڕ تووشی دەبێت، بەهۆی ئەوەی پشتی لەمردن کرد، والله اعلم - ، وە شوێنی ناکەوێ ئەوەی ساف و پاك و بێ خەوشە تەنها لێڵی و پیسی نەبێ .

جا وریای بە بەڕاستی گەرەنتیدانەکەی - دونیا - درۆیە، وە هیوا و ئومێدەکەی باتڵە، وە ژیانەکەی تەنگ و چەڵەمە و ناخۆشیە، وە پاك و سافەکەی لێڵ و پیسیە، وە تۆ لە مەترسیدایت تێیدا. یان نیعمەتێکی

ڕۆیشتووه، وه یان تاقیكردنهوهیهكی دابهزیوه، وه یان بهڵا و موسیبهتێكی زۆر گهورهیه، وه یان ئاوات خواستنێكه كه خاوهنهكهی بههیلاكچوو دهبات و لهناوی دهبات .

جا بێگومان ژیانكردن ئاڵۆز بووه بۆ ئهو كهسهی كه تێبگات، وه ئهو له خۆشیهكانی دونیا له مهترسیدایه، وه له لێواری بهڵا و موسیبهتهكاندایه، وه یهقینیشی ههیه كهوا دهمرێت، جا ئهگهر دروستكار تبارك اسمه هیچ ههواڵێكی نهدابا دهربارهی دونیا، وه هیچ نموونهیهكی بۆ نههێنابایهتهوه، وه فهرمانی نهكردبا به زوهد - تهرك كردنی - دونیا ئهوا دونیا خۆی خهوتووی به خهبهر دههێنا و بێئاگای ئاگادار دهكردهوه، چجای له لایهن الله تعالی ههواڵ هاتووه به وازهێنان له دونیا، وه ئامۆژگاری تێدایه، وه له لای ئهو - الله تعالی - دونیا هیچ قیمهتێكی نییه، وه له لای ئهو دونیا كێشی باڵه مێشوولهیهكی نییه، وه لهلای الله تعالی دونیا بچووكتره له دهنكه لمێك له ناو بهردهكان، وه له ئهندازهی دهنكه تۆوێك له تۆوهكان .

الله تعالی هیچ دروستكراوێكی دروست نهكردووه لهوهی كهوا پێمان گهیشتووه زیاتر ڕقی لێی ببێتهوه له دونیا، تهماشای نهكردووه لهوكاتهوهی دروستی كردووه .

وە بێگومان دونیا بەخشرا بە پێغەمبەرمان محمد ﷺ بە کلیل و خەزێنەکانیەوە کە ئەوە بە ئەندازەی باڵە مێشوولەیەك لە موڵکی الله تعالی کەم ناکاتەوە، جا پێغەمبەر ﷺ ئینکاری ئەوەی کرد قبوڵی بکات، وە ڕێگری لێ نەکرد لە قبوڵ کردنی - لەگەڵ ئەوەی کەوا الله تعالی هیچ شتێکی لێ کەم ناکاتەوە لەوەی کەوا لە لایەتی وەکو ئەوەی بەڵێنی پێداوە. تەنها ئەوە نەبێ کەوا پێغەمبەر زانی کەوا الله تعالی ڕقی لە دونیایە جا ئەویش ڕقی لێ بووەوە، وە الله تعالی دونیای بە بچووك سەیر کردووە ئەویش بە بچووك سەیری کرد، وە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ قبوڵی کردبا ئەوا ئەو قبوڵکردنەی بەڵگە بوو بۆ خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ دونیا، بەڵام پێی ناخۆش بوو کەوا پێچەوانەی فەرمانی الله تعالی بکات، یان خۆشی بوێت ئەوەی دروستکارەکەی ڕقی لێیە، یان بەرزی بکاتەوە ئەوەی کەوا پاشاکەی - الله تعالی - نزمی کردووەتەوە.

محمد ی کوڕی حسێن دەڵێت:

لە کۆتایی ئەو پەیامە:

وە ئەمین مەبە لەوەی کەوا ئەو ووتانە ببێتە بەڵگە لەسەرت.

الله تعالی سوود بە ئێمە و تۆش ببەخشێ بەو ئامۆژگاریيانە.

والسلام عليك ورحمه الله .

**٣٢ – هيشام** ی كوڕی **ڕەبع** ی دەڵێت : خوێندمەوە لە تەوراتدا هاتووە :

كەوا ئاسمانەكان و زەوی چل ساڵ لەسەر عمری كوڕی عبدالعزیز دەگرین .

**٣٣ – فاطمە** ی كچی **عبدالملك** - خێزانی عمری كوڕی عبدالعزیز - وتی : بیستم عمر رحمە الله لەو نەخۆشیەی كەوا بەهۆیەوە مرد دەیوت : ئەی الله مردنم لەسەریان سووك بكە ئەگەرچی كاتژمێرێكیش بێت لە ڕۆژدا .

فاطمە دەڵێت : ڕۆژێك بە عمرم وت : ئەی پێشەوای ئیمانداران، ئایا لا نەچم لە لات بەڵكو كەمێك بخەوی چونكە بەڕاستی تۆ هیچ خەوت لێنەكەوتووە .

فاطمە دەڵێت : جا ڕۆیشتم لە لای بۆ ماڵێك جگە لەو ماڵەی ئەوی - عمری كوڕی عبدالعزیز - لێبوو .

فاطمە دەڵێت : دەمبیست عمر دەیفەرموو ﴿**تِلۡكَ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ نَجۡعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوّٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فَسَادٗاۚ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ**﴾ [القَصَص - ٨٣] :

واته : ئەو ماڵەی تر - بەهەشت - دادەنێین بۆ ئەو كەسانەی نایانەوێ دەعیەو خراپەكاریی بكەن لە زەوییدا، پاشەڕۆژی چاكیش هەر بۆ پارێزكارانە نەك بۆ لە خۆبایی بووان بە كورسی، یان بە سامان و دارایی .

بەردەوام دەیووتەوە، دوای ئەوە بێ دەنگ بوو، ماوەیەكی درێژی پێ چوو هیچی لێ نەبیسترا، ووتم بە منالێك كە خزمەتی دەكرد : هاوار بۆ تۆ، سەیرێكی بكە، كاتێ چووە ژوورەوە هاواری كرد، فاطمە وتی : چوومە ژوورەوە بۆ لای بینیم مردووە، ڕووی كردووەتە قیبلە، وە دەستێكی داناوە لەسەر دەمی، وە دەستەكەی تری لەسەر هەردوو چاوی ڕەحمەتی الله تعالی لێبێت .

**٣٤ - لە یەعمەر ی كوڕی عبدالله وە** - نووسەری عمری كوڕی عبدالعزیز - دەڵێ : كەوا عمری كوڕی عبدالعزیز فەرمووی : بەڕاستی ئەوەی ڕێگریم لێدەكات لە زۆری قسە كردن و ووتاردان ترسی شانازی كردن و خۆ بەگەورە زانینە .

**٣٥ - عبدالرحمان ی كوڕی یزید ی كوڕی جابر** بۆی گێڕاینەوە : كەوا عمری كوڕی عبدالعزیز نووسی بۆ یزیدی كوڕی عبدالملك : ئاگاداربە نەكەی خۆت بە زاڵ و گەورە بزانی لەكاتی دەسەڵاتداریدا، دوایی نەڵێی پێم هەڵخلیسكا و نەمزانی، وە دەسەڵاتت نەبێ لە گەڕانەوە - نەتوانی هەڵەكانت

ڕاست بکەیتەوە، والله اعلم - ، وە ئەو کەسەی کە لە دوای خۆت جێتهێشتووە سوپاست نەکات لەبۆ ئەوەی کەوا بۆت جێهێشتووە، وە عوزرت پێ نەدات ئەوەی پێشی دەخەیت لەسەری بەوەی پێی مەشغول بوویت . والسلام .

**٣٦ - مسلمة** وتی : چوومە لای عمری کوڕی عبدالعزیز دوای نوێژی بەیانی لە ماڵێك کە بەتەنیا دەمایەوە تێیدا دوای نوێژی بەیانی، هیچ کەسێك نەدەچوو بۆ لای لەو کاتەدا، پاشان کەنیزەکێك هات کە قاپێك خورمای .صیحانی . پێ بوو، عمر زۆر حەزی لە خورما بوو مشتێك خورمای هەڵگرت و جا وتی : ئەی مسلمة، وای دەبینی ئەگەر پیاوێ ئەوە بخوات - مشتە خورماکە - ، دوای ئەوە ئاوی لەسەر خواردەوە، چونکە بەڕاستی ئاو لەسەر خورما زۆر خۆشە، ئایا بەسی نییە تاکو شەو .

مسلمة دەڵێ : وتم : نازانم، جا عمر زیاتر لە مشتێکی هەڵگرت و وتی : ئەی ئەوەندە؟

جا وتم - واتە مسلمة - : بەڵێ ئەی پێشەوای ئیمانداران، ئەوەندە بەسە بۆی هەتا گوێ نادات کەوا تامی خواردنی دیکە بچێژێ جگە لەو .

عمر فەرمووی : جا کەواتە لەسەر چی دەچێتە ئاگرەوە؟!

مسلمة وتی : هیچ ئامۆژگارییەك کاریگەری لێنەکردووم بە ئەندازەی ئەو ئامۆژگارییە .

**٣٧ - فاطمه** ی كچی **عبدالملك** وتی : ئەی موغیره، دەكرێت لەناو پیاواندا هەبێ كەسێ نوێژ و ڕۆژووی زیاتر بێ لە عمری كوڕی عبدالعزیز، بەڵام نەمبینیوە كەسێك هەبێ لەناو پیاواندا لە خواترس تر لەعمر، هەركاتێك دەهاتەوەماڵی خۆی دەچووە ناو مزگەوتەكەی - لە شوێنێكی ماڵی خۆی، والله اعلم - ، بەردەوام دەگریا و دەپاڕایەوە هەتا چاوەكانی بەسەریدا زاڵ دەبوون و فرمێسكیان لێ دەهاتە خوارەوە، بەهەمان شێوەی دەكرد بەدرێژایی شەوەكەی .

**٣٨ – ئیبراهیم** ی كوڕی **عبید** ی كوڕی **رفاعە** وتی : عمری كوڕی عبدالعزیزم بینی وە محمدی كوڕی قیس قسەی بۆ دەكرد، جا بینیم عمری كوڕی عبدالعزیز دەگریا هەتا پەراسووەكانی لێك جیادەبوونەوە - لە زۆری گریانەكەی، والله اعلم - .

**٣٩ - نضر** ی كوڕی **سهل** لە باوكیەوە وتی : ڕۆژێكیان لە لای عمری كوڕی عبدالعزیز دانیشتبووین، كاتێك بە خزمەتكارێكی خۆی وت : ئەی جاریە - خزمەتكارەكە - ، باوەشێنەم لێ بكە .

سهل دەڵێ : جاریەكە باوەشێنەكەی هەڵگرت و باوەشێنەی لێ دەكرد، جا چاوی زاڵ بوو بەسەریدا خەوی لێكەوت، عمر سەیری كرد جاریەكە

ڕووخسار سوور بووەتەوە - لە گەرما - ، وە ئارەقێكی زۆری كردووە وە لە خەودایە،

سهل دەڵێ : عمری كوڕی عبدالعزیز باوەشێنەكەی وەرگرت و باوەشێنەی لێ كرد،

سهل دەڵێ : جاریەكە بە ئاگا هاتەوە، دەستی لەسەر سەری دانا و قیژاندی، عمری كوڕی عبدالعزیز پێی وت : بێگومان تۆ مرۆڤێكی وەكو من، تووشت دەبێ بەهۆی گەرماوە ئەوەی تووشی من دەبێ، بۆیە پێم خۆش بوو باوەشێنەت لێبكەم وەكو ئەوەی تۆ باوەشێنەم لێدەكەیت .

سهل دەڵێ : جاریەكە بە عمری وت : ئەی پێشەوای ئیمانداران، بەڕاستی من بەو باوەشێنەكردنەت بۆم بەخەبەر نەهاتم، بەڵكو لە نووستنەكەمدا خەوێكم بینی .

عمری كوڕی عبدالعزیز پێی وت : چیت بینی لە خەوەكەتد؟

جاریەكە وتی : بینیم ڕۆژی قیامەت هەڵسابوو، وەكو ئەوەی تەرازوو هەڵواسرابێت، وە وەكو ئەوەی پردی صیرات هەڵواسرابێ - بەسەر پشتی جهنم - ، لەوكاتەدا بانگكەرێ بانگی كرد، ئەو خەلیفەی پێش عمری كوڕی عبدالعزیز لەكوێیە؟

جاریەکە وتی : خەلیفەکە هێنرا بۆی، سوێند بە الله ئەی پێشەوای ئیمانداران وە من سەیریم دەکرد، وە دەستی بە گەردنی بەسترا بۆوە، جا لە لێواری ئاگری دۆزەخ وەستێنرا، جا بانگکەرێ بانگی کرد : ئەوە ئەوکەسەیە کە زوڵمی لە کتاب کرد - بەوەی کە حوکمی پێنەکردووە، والله اعلم - ، وە خراپەکاری کرد لە ناو بەندەکاندا، فڕێی بدەنە ناو ئاگرەوە .

جاریەکە وتی : جا سەراو سەر کەوتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ئەی پێشەوای ئیمانداران .

پاشان بۆ دووەم جار بانگی کردەوە : ئەو خەلیفەی لە پێش ئەوەوە بوو لە کوێیە؟

جاریەکە وتی : هێنایان بۆ لای سوێند بە الله ئەی پێشەوای ئیمانداران وە من سەیریم دەکرد، وە دەستی بەسترابۆوە بەگەردنی، جا لە لێواری ئاگری دۆزەخ وەستێنرا، جا بانگکەرێ بانگی کرد : ئەی ئەوکەسەی زوڵمی لە کتاب کرد - بەوەی کە حوکمی پێنەکردووە، والله اعلم - ، وە خراپەکاری کرد لە ناو بەندەکاندا، فڕێی بدەنە ناو ئاگرەوە .

جاریەکە وتی : سەراو سەر کەوتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ئەی پێشەوای ئیمانداران .

جاریەکە وتی : جا هاواری کرد عمری کوڕی عبدالعزیز هاوارکردنێك هەموو شەو و ڕۆژەکە مایەوە لە پەل و پۆ کەوت وەکو لە پەل و پۆ کەوتنی گا هەتاوەکو میزی کرد .

جا زانیمان کەوا ئاگای لە خۆی نەماوە - بووراوەتەوە - ، دوای ئەوە سەرمای بەیانیان لێیدا، جا بە ئاگا هاتەوە، پاشان بە جاریەکەی وت : ئەی جاریەکە، دوایی چی بوو؟

جاریەکە وتی : دوای ئەوە تۆ هێنرایت سوێند بە الله ئەی پێشەوای ئیمانداران وە من سەیرم دەکردیت، وە دەستت بەسترابۆوە بە گەردنت، جا وەستێنرایت لەسەر لێواری ئاگری دۆزەخ، جا بانگکەرێ بانگی کرد : بەڕاستی ئەوە حوکمی کرد بە کتاب - بە قورئان و سوننەت - ، وە دادپەروەری کرد لە نێوان بەندەکان، بیخەنە بەهەشتەوە، جا سوپاس وستایشی الله تعالى ی کرد لەسەری - پاراستی لە ئاگری دۆزەخ و خرانە بەهەشتەوە، والله اعلم - .

